# میر بەدرخان

وەرگێڕانی بۆ کوردی: جەمال گردەسۆری

ناوی کتێب: میر بەدرخان

نووسینی: لوتفی

گۆڕینی لە تورکیەوە بۆ عەرەبی: عەلی سەیدۆ گەورانی

پێداچوونەوەی: ڕەوشەن بەدرخان

ئامادە کردن و بڵاوکردنەوەی: دلاوەر زەنگی

گۆڕینی بۆ زمانی کوردی: جەمال گردەسۆری

چاپ: چاپخانەی رۆشنبیری وەزارەتی رۆشنبیری

ساڵ: ۱۹۹۹ - هەولێر

لەسەر ئەرکی یەکێتی نووسەرانی کورد / لقی هەولێر، لە کۆمپیوتەری نووسەران پیتچنین کارە هونەری کراوە.

# میرانی جەزیرە

مەبەست لە جەزیرە ، جەزیرەی بۆتانە هەروەکوو کوردەکان وایان ناو لێناوە یان جەزیرەی کوری عومەر. کە ناوی بەم شێوەیە هاتووە لە مێژووی عەرەبەکاندا. ئەم ناوەش دەگەڕێتەوە خەلیفەی سەرناوی عومەری کوری عەبدولعەزیز جێنشینی هەشتەمینی خەلیفەی ئەمەویەکان کە فەرمانی دا بە دروست کردنی قەڵایەك لە ناوی‌دا شاری جەزیرەش لە شارە کۆنەکانە کە لە سەردەمی جێنشینی عومەری کوڕی خەتاب (رض) کەوتە ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانەکانەوە لە ساڵی (١٧) کۆچی بەرامبەر (٦٣٧)ی زایینی بە شێوەیەکی ئاشتیانە ئەویش بە هەوڵ و تەقەلای ئەبی موسائەل‌ئەشعەری و عەیازی کوڕی غەنەم.

لە کتێبی (شەرەفنامە)دا کە دەربارەی مێژووی کوردەکانە بە زمانی فارسی لە لایەن میرشەرەفخان میر بەدلیس نووسراوە لە ساڵی (١٠٠٥)ی کۆچی و بەرامبەر (١٥٩٦)ی زایینی دا واهاتووە کە میرانی جەزیرە لە نەژاد دا دەگەڕێنەوە سەر (خالید کوڕی وەلید).

بەلاّم مامۆستا محەمەد ئەمین زەگی کە نووسەری کتێبی مێــژووی ولاّت و میرنشــینە کوردەکانــە لــە ســەردەمی ئیسلامی‌دا کە لە سالّی ١٩٤٥ لە قاهیرە چاپ کراوە بیر و رایەکی تری هەیە و دەلێ هەوالّەکانی راستی مێژوو ئەوە دەلێن کەوا (خالد کوڕی ولید) تەرمەکەی لە شاری (حمص) نێژراوە، واش دەگێڕدرێتەوە کە (سلیمان کوڕی خالد) لە شەڕی (صفین) کوژراوە. هەروەها خاوەنی کتێبی (اسد الغابە) واتە شێری دارستان دەلێت: لە بنەمالّەی خالد دا هیچ کەسێ نەماوە چونکە هەموویان بە نەخۆشی (طاعون) مردن، لەبەر ئەوە بوو ئەو شتانەی کە هەیبوو بە میراتی بۆ (ئەیوب کوڕی مسلمە) مایەوە کە لە شاری (مەدینە) دادەنیشت، لەو سەردەمانەدا خۆ بردنە سەر بنەمالّەی گەورە و پیاوانی موسولّمان و عەرەب کارێکی باو بوو، دەبینین پیاوە ئاینیەکان و رامیارەکان لە جیهانی ئیسلامی‌دا. لە عەرەب و لە گەلانی‌تردا هەولّیان دەدا کە خۆیان ببەنەوە سەر بنەمالّەی یاوەرانی پێغەمبەر (ص) و گەورە سەرکردە موسولّمانەکان بۆ ئەوەی خۆیان لە گەلەکانیان نیزیك بکەنەوە و ببنە جێی باوەڕیان و فەرمانڕەوایی خۆشیان درێژەی پێ بدەن و بەهێزی بکەن. ئەوی زانراوە لە مێژوودا ئەوەیە کە میرنشینی جەزیرە بۆ یەکەمین جار سەری هەلّداوە لە دوای هاتنی موسولّمانەکان لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا. یەکەمین فەرمانڕەوا میر عەبدولعەزیز بوو، لە کوردەکانی بۆتان بوو لە ژێر سایەی فەرمانڕەوایی ئەوەوە ولاّت گەلێ

بەرەو پێش چوو. لە پاش ئەودا کوڕەکەی هاتە شوێنیەوە کە ناوی (سیف الدین) بوو، ئەویش لە سەر ڕێگەی باوکی ڕۆیشت لە بەڕێوەبردنی کار و باری وڵاتدا لە پاش ئەو فەرمانڕەوایی کەوتە دەست براکەی (مجدالدین) کە فەرمانڕەوایەکەی بە شێوەیەکی بەختەوەرانە درێژەی کێشا، پاش ئەو کوڕەکەی شوێنی ئەوی گرتەوە کە ناوی میر عیسا بوو. ئەو توانی دڵی هەموو کەسێ بۆ خۆی رابکێشێ و جێی باوەڕیان بێ. هەروەها ئازاری هیچ کەسێکی نەدەدا، پاش مردنی ئەو کوڕەکەی میر بدرالدین هاتە شوێنیەوە کە بە شێوەیەکی زۆر ڕێك و پێك کاروباری بەڕێوە دەبرد، هەروەها مایەوە هەتا دووا ڕۆژی ژیانی ، ئەویش مرد و میر (ئەبدال)ی کوڕی جێگەی گرتەوە و پاش مردنی ئەوەش میر (عزالدین)ی کوڕی هاتەشوێنیەوە، هەر لەم ڕۆژگارەدا بنەماڵەی فەرمانڕەواکان بە بنەماڵەی (العزیزیە) ناوبانگی دەرکرد کە کوڕەکانیش ناویان لێ ناوە بنەماڵەی (عەزیزان) لە سەردەمی ئەم میرەدا (تەیمور لەنگ)ی داگیر کەر گەیشتبووە ئەم ناوچەیە، لە کاتی گەیشتنی بۆ شاری ماردین میر (عزالدین) چوو بۆ لای ئەوەی چاوی پێبکەوێ، مل کەچی خۆی بۆ پێشاندا بەم جۆرە وڵاتەکەی دوور خستەوەلە کارەساتەکانی شەڕ. بەڵام لە سەردەمی کوڕی تەیموردا ملکەچیەتی نەماو شەڕ کەوتە نیوانیانەوە تەیموور بە تەتەرەکان هێرشیان بردە سەریان و وڵاتیان داگیر کردن، میر (عزالدین) زۆر بە زەحمەت توانی خۆی ڕزگار بکات، پاش

ئەوەی دەسەڵاتی تەیموورەکان لە وڵاتدا نەما نەوەکانی میرنشینەکەیان زیندوو کردەوە، ئەمەش تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمی زایینی درێژەی کێشا. لە ساڵی (١٨٤٧)دا کۆتایی پێهات بە هۆی شۆڕشی دوا میرەکانیان (بصدرخان پاشای عەزیزی) باپیرە گەورەی ئەم خێزانە رۆشنبیرە گەورەیە لە شام و کوردستان و تورکیادا میری جەزیرە (بەدرخان پاشا) سرکردایەتی جووڵانەوەیەکی بەرگری کرددژی دەوڵەتی عوسمانی بە کۆتایی هاتنی ساڵی (١٨٤٢) توانی چەند هەرێمێکی کورد نشین بکا بە یەك کە بریتی بوو لەو هەرێمەی کە دەکەوێتە نێوان هەر دوو دەریاچەی وان و ئورمیە لە باکوورەوە هەتا موسڵو رەواندوز لە باشوورەوە، بەڵام تورکەکان توانیان دانیشتوە مەسیحیەکان و سریانیەکان دژ بە ئەو هان بدەن. ئەوان بڕیاریاندا باج و سەرانە بەئەو نەدەن. ئەویش سزایەکی زۆر توندی دان.

لەم کاتەدا بەریتانیا و فەرەنسا داوایەکی زۆریان لە سوڵتان کرد بۆ پاراستنی گیانی مەسیحیەکان پاشان تورکەکان بە هۆی خیانەتکاری یەکێ لە خزمەکانی میر توانیان بەسەریا زاڵ بن و دەسگیری بکەن و لەگەڵ خێزانەکەیدا رەوانەی ئەستەنبۆلی بکەن ساڵی (١٨٤٧)، بەمەوە توانرا دوا (میرنشینی کوردی سەر بە خۆ لە ناو ببرێت و پاش ئەمەش ماوە نەدرا بە ئەندامانی ئەم خێزانە

جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆتان. بەڵام بەدرخانیەکان وازیان لە چالاکی کوردانەی خۆیان نەهێنا لەگەڵ سەرکردە ناسراوەکانی تری کورد چەند کۆمەڵەو پارتێکی کوردیان پێکەوە نا. یەك لەمانە کۆمەڵەی (تعاون تەرقی) بوو کە لە ساڵی (١٩٠٨)دا دایانمەزراند لە ئەستەنبووڵدا، بەشداربووان ئەمین عالی بەگ بەدرخان و جەنەراڵ شەریف پاشا و عبدالقادر ئەفەندی کە کوڕی عبێدڵلای نەهری بوو هەروەها مشیر ئەحمەدی کفل پاشا بوون، کاتێ یەکێتی تورکەکان فەرمانڕەوایان گرتە دەست ئەم کۆمەڵەیان نەهێشت. جگە لە چەندان کۆمەڵەی تری کورد، بەڵام کۆمەڵەی تعاون تەرەقی هاوکاری کردن پێشکەوتن کە ئێستا باسمان لێوە کرد بە نهێنی بەردەوام بوو لە سەر چالاکیەکانی خۆیدا. ئەوەش بەم جۆرە مایەوە هەتا هەڵگیرساندنی شەڕی جیهانی یەکەم پاشان دەستی بە کارکردن کردەوە تا ئەو کاتەی کە کەماڵیەکان ئەستانبووڵیان لە هاوپەیمانەکان وەرگرت. لە پاش شەڕ وەستان (ثریا بەگ بەدرخان) لە قاهیرەدا کۆمەڵەی کوردی سەربەخۆی دامەزراند.

هەروەها عبدالقادر ئەفەندی کۆمەڵەی (تەعالی کوردستان)ی دامەزراند، بەڵام بەدرخانیەکان لە دوا دواییدا

لیی جیا بوونەوە کۆمەڵەی (پێک هاتنی کۆمەڵایەتی کوردستان)یان دامەزراند. ئەم کۆمەڵانەش بەردەوام بوون لە سەر چالاکی خۆیان، هەتا هاتنی کەمالیەکان لە ئەستەنبوول، لە دوای ئەوەشدا بەدرخانیەکان و سەرکردە کوردەکانی تر کۆمەڵەیەکی تریان دامەزراند بە ناوی (خۆیبوون، سەربەخۆیی (استقلال)) لە دەرەوەی تورکیادا.

لە سەردەمی ئینتدابی فەرەنسی لە سوریا و لوبناندا میرانی بەدرخانیەکان چالاکیان دەست پێکردەوە و برایان ثریا بەگ و جەلادەت بەگ و دکتۆر کامەران. ئەوانەش کوڕانی (عالی بەدرخان) بوون. دەستێکی بالآیان هەبوو لە رامیاری و رۆشنبیری کوردی. ثریا بەگ و جەلادەت بەگ هەردووکیان مردن بەلآم تا ئێستاش دکتۆر کامەران لە ژیاندایە و مامۆستای زمانی کوردیە لە کۆلیجی زمانە رۆژهەلآتیەکان لە دانیشگای پاریس دا. بە زمانی کرمانجی ژوورو بە پیتی لاتینی بەرهەمێکی زۆری داناوە، توانی چەند بەشێکی گەورەی قورئانی پیرۆز بگۆرێتە سەر زمانی کوردی، هەوەها زۆر لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) هێنایە سەر زمانی کوردی و هەروەها چوارینەکانی عومەر خەیام. لە بەرهەمەکانی تری کتێبی رێزمانی کوردی و چەند بەرهەمێکی تری ئەدەبی، هەروەها لە سەر ئینتدابی

فەرەنسی خۆی و براکەی جەلادەت عالی بەدرخان دەستیان کرد بە دەرکردنی دوو گۆڤار بە زمانی کوردی (رۆناهی) و (هاوار) لە دیمشق و بەیروتدا هەر بە هۆی دکتۆر کامەرانەوە بوو کە توانرا گۆشەیەك بە زمانی کوردی لە رادیۆی لوبنان دا بهێنرێتە دی، هەر بە خۆی ئامادەی دەکرد و پێشکەشی دەکرد، ئەوەش لە بیر ناکرێ خۆی و براکەی جەلادەت زمانی کوردیان دەوڵەمەند کرد بە زاراوە و ووشەی نوێ لە بواری زانستی و وێژەدا.

**عەلی سەیدۆ گەورانی**

**١٩٧٧/٧/١٠**

# پێشەکی

لە نووسینەوەی ئەم بابەتەدا تەنها مەبەستم خستنە روو نیە، بەڵکو داننانە بە بێتوانایيم و کارکردن لە سەر دەرخستنی هەموو نهێنیيە راستەقینەکان بۆ گەل. بۆ ئەوەی لە دوا رۆژ گەواهی دەرێك هەبێت بۆ رۆشنبیران و خاوەن دڵانی پاك. هەروەها بەم زوانەی تێگەیاندنی کۆمەڵەکەمان لەو پیلانانەی کە دژی ئەم راستیە دەکرێ و بە مەبەستی لە ناو بردن و زیانگەیاندنیش بە خێزانی بەدرخانیەکان.

ئەوەی بە بنەماڵەی بەدرخانیەکان کراوە هەر لە سەردەمی هاتنی ئایینی ئیسلامی بۆ ئەو ناوچەیە هەتاکوو ئێستا شتی وەها بە هیچ کەسێ نەکراوە، تەنها بە خێزانی بەرامیەکان نەبێ لە سەردەمی عەباسیەکاندا لە ستەم و ئەشکەنجە و چەوساندنەوەدا، مەبەستم لەم شتە ئەوەیە ژیانی پایەدار میربەدرخان بنووسمەوە و خستنە رووی ئەو ستەمەی کە لێی کراوە و ئەو ناخۆشیانەی کە تووشیان کردووە. لە نێوان ئەم سی ساڵەی دواییدا کە پەنهان کرابوو تا نووسینەوەی ئەم نامیلکەیە.

# میر بەدرخان

ئـەم گـەلی کـوردەی کـە هـەردەم هـەوڵی دەدا بـۆ بـەرز کردنەوەی ووشەی (الله) هیچ کاتێ دوا نەدەکەوت. بۆ پشت گرتـن و یارمـەتی دانـی سـوڵتان (یـاوز سـلیم) لـە کـاتی شـەڕەکانیدا لەگـەڵ پاشـاکانی فارسـە سـەفەویەکاندا.ئـەم میللەتەت وای دەبینی ئەم مل کەچ کردنێکە بۆ فەرمانـەکانی خوا بۆ ڕێز گرتنێك لە هەڵوێستە، سوڵتان خودمختاریـەکیدا بـە میرنشـینە کوردەکـان لـە کوردسـتاندا، بـەڵام ئـەو سـوڵتانانەی لـە دوای ئـەوەوە هـاتن هـەوڵیان دا ئـەو میرنشینانە نـەك هـەر بێهێز کـەن و بـەڵکو هـەوڵی ئـەوەیان دەدا کە لە ناویان بەرن.

ئەویش بە بەکار هێنانی فرت و فێڵ و درۆ و دەلەسە، بە تایبـەتی لـە سـەر میرانی هـۆزی ئـەزیزی، ئەمانـە تـەنها دوو منداڵیان لێ رزگار بوو، لە هەرێمکی (شرنخ) کـاتێ کـە گـەورە بوون توانیان میرنشینەکەیان وەکوو جاران لێ بکەنـەوە هـەر بـەم شـێوەیە مایـەوە هـەتا هـاتنی مـیر محمـد کـە توانـی سـنوورەکانی سـەردەمی بـاوك و باپـیرانی بـۆ میرنشـینەکە

بگرێتەوە و لەگەڵ هێزو سەربلندیەکەیدا میر بەدرخان ئەو (کوڕی عبدلله خان کوڕی مستەفا خان کوڕی ئیسماعیل خان کوڕی مەنسوور خان کوڕی میر شەرەفخانی دووەم کوڕی میر محمد خان کوڕی میر شەرەفخانی یەکەم).

پاشان ناوی بنەماڵەکە درێژەی پێدەدرێت وەکوو چۆن لە کتێبی شەرەفنامەدا هاتووە، کە لە لەندەن چاپ کراوە.

عبدالله خان باوکی ئەو میر بەدرخانەیە کە ئێمە لەم باسەیەدا دەربارەی دەنوسین پاش مردنی کوڕە مامەکەی میر سیف الدین بەگ دەبێتە جێنشینی ئەو، تا رادەیەك دڵپاك و خوا پەرەست و دوور لە خۆشی دونیا بوو و نەیدەتوانی بە شێوەیەکی رێك و پێك کار و باری میر نشینەکە بەڕێوە ببات، یاسا کەی شێواو و سەرەك هۆزەکان مل کەچیان بۆ نەدەکرد، بەدرخان بەگ نەیدەتوانی لەم دیاردەیە بێ دەنگ بێت جا دەستی خۆی خستە نێو کار و باری میر نشینەوە.

میر (سیف الدین) ئەو دانی بەوە دانا کە توانای بەڕێوەبردنی کار و باری حکومەتەکەی نیە لەبەر ئەوەی خۆی لە فەرمانڕەوایی کێشایەوە و تەنها خەریکی خوا پەرەستی بوو، یاسای گرتە دەستی فەرمانڕەوایی لە میر نشینەکەدا بەم شێوەیە بوو کە دەبێ کوڕە گەورە جێنشین بێ.

میر (ساڵح بەگ) کە کوڕە گەورەی عبدالله بەگ بوو بوو بە جێنشین. ئەوەشیان هەر لە تافی لاوێتی دا خەریکی خواپەرەستی بوو، خۆی دوور خستبۆوە لە خۆشیەکانی دونیادا، هەوڵی دەدا خۆی دوور بخاتەوە لە فەرمانڕەوایی، بەڵام ناچار بوو واز لە جێنشینیەکەی نەهێنێ چونکە براکەی نەیدەهێشت، لەگەڵ ئەوەشدا هەر خەریکی خوا پەرەستی بوو لە سەر ڕێگەی نەقشبەندی بە خوێندنەوەی دوعا و زیکری خوا هەتا گەیشتە پلەیەکی سەرنج ڕاکێش پاشان وازی لە میرنشینی هێنا. لە هەمان کاتدا بەدرخان بەم غیرەتە نەتەوەییەی کە هەیبوو توانی دڵی هەموو لایەك بۆ لای خۆی رابکێشێ و جا هەموو لایەك پەیمانیان پێدا کە ئەو ببێ بە جێنشین. تاکو ئەمڕۆش کوردەکان شانازی دەکەن بەو سەردەمە بەختەوەریەی کە لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەودا سەری هەڵدا.

هەر کە بوو بە جێنشین یەکسەر دەستی کرد بە رێکخستنی کاروباری وڵاتەکە و هاندانی دروست کردنی خانوبەرەو کۆشك و تەلاری رێك و پێك. (مەلا عبدالقدوس)ی کردە شێخی ئیسلام، طاهیر ئاغا (طاهیر مامۆ)ی کردە سەرکردەی گشتی سوپا، حامد ئاغای کردە سەرکردەی تیپی سوارە، ئەفەندی ئاغای کردە چاودێری خەزێنە و

کاروباری تایبەتی. جۆری پێکهێنانی سەربازی وای لەگەڵ دەکرد کە هەموو لایەك تیایدا بەشداری بکەن و چەکداربن هەر هۆزی دەبایە (١٠٠) سوارە و پیادەی بناردبا، بەم جۆرە سەربازیەتیشی لە ژێر دەسەلاتی حامد ئاغا بوو، هەروەها کار و باری ناوەوەی میرنشینەکە بە گوێرەی شەریعتی پاکی ئیسلام بەڕێوە دەچوو.

دەستەیەکی فەرمانڕەوایی هەبوو بۆ دەرکردنی هەموو جۆرە بڕیارێك کە پێك هاتبوو لە گەورە پیاوە ئایینیەکان بە سەرۆکایەتی شێخی ئیسلام، هەروەها ئەنجومەنێکی میری راوێژکار، میر خۆی دەسەلاتی جێبەجێکردنی گرتبوە ئەستۆ لەبەر ئەوەی خزمەت کاری شەریعەتە.

بۆ ماوەی (١٢) ساڵ هەر بەم شێوەیە مایەوە، لە مزگەوتەکان خوتبە بە ناوی ئەوەوە دەخوێندرایەوە لە ژێر نازناوی خزمەتکاری شەریعەتی پیرۆزدا هیوا و ئاواتی هەرە گەورەی میر بلأوکردنەوەی هێمنی و ئاسایش بوو لە وولاتدا و هەروەها بەختەوەر کردنی میللەتەکەی داد پەروەریەکەی گەیشتە رادەیەك لە بەرزی دا وای لێهاتبوو دەیانگوت گورگ و مەڕ لە سەردەمی ئەودا پێکەوە لە یەك پاواندا دەخولانەوە، دادپەروەریەکەی بەم شێوەیە باسی دەکرا.

لــە وەســفی داد پەروەرییەکــەی دا دەیــانگوت: (داد پەروەری بەدرخان، بــەدرخانیش دادپەروەریــە)، هــەروەها هــەموو هۆنــراوە و سرروودەکانی میللــی باســی ئازایــەتی و رەوشــت بــەرزی ئــەو دەکــەن و چــەندان بەســەرهاتی لێدەگێڕنەوە. بۆ نموونە ئەمەش یەکێ لەم بەسەرهاتانەیە: (دەڵێن رۆژێکیان شوانێك لە کاتی مەڕ لەوەڕاندندا خەو دەیباتەوە، رووی سووڕاندە لای پایتەختی میر نشینەوە و گوتــی ئــەی میرەکــەم مــن مــەڕەکانم دەخەمــە دەســت داد پەروەریت لێی دەخەوم. لە کاتی خەوتندا گورگ ژمارەیەك لە مەڕەکانی دەخواتن کە بە خەبەر هات سەیری کرد گورگ هەندێ لە مەڕەکانیخواردوون ئەوانەی کە مابوونەوە بەرەو کۆشــکی مــیر وەپێشــە خــۆی دان، چــووە لای مــیر و بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە، میر زیانەکەی بۆ دایەوە و فەرمانی دا بە چەند کەسێك کە بچن بۆ شوێنەکە و ئەو گورگانــەی کــە لێــی دەبینــن بیکــوژن. بەمــەوە بــۆ شــوانەکە راستی دادپەروەریەکەی بە دیار کەوت و هەروەها دواندنی خەڵك بە گوێرەی بیر و هۆشیان). پاش ئەوەی کار و بار بۆ میر رێکخران هەروەها هێمنی و ئاسایش و یاسای ناوەوە جێگر بوون ئینجا بڕیارێکی لە ئەنجوومەنی شەرعی وەرگرت بۆ دژایەتی کردنی ئەو هۆزانــەی کــە ستەمیان لــە خــەڵکی

بێگوناه دەکرد و ڕێگریان دەکرد. تا توانی ستەمکاری ئەوان کۆتایی پێبێنێ و جەڵەوی توند کردن. پاشان رووی کردە هۆزەکانی دەوروپشتی میرنشینەکەی کە خەریکی بڵاوکردنەوەی کاری ناپەسەند ببوون. ئەوانیشی چاوشکێن کرد و خستنیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و ئا لەم کاتەدا ئیبراهیم پاشای میسری سەری هەڵدا کە لە خاکی عوسمانیەکان بوو داوای لە میر کرد کە یارمەتی بدات. میر سەد هەزار سەربازی بۆ نارد کە دەگەڵ هێزەکانی میری پێکەوە دژی عوسمانیەکان جەنگان لە شەڕی (نزیب)ی بە ناوبانگ عوسمانیەکان دۆڕاندیان چونکە سەرکردەکەیان بە لێهاتوویی شەڕی نەکرد، هەروەها میریش سێ یەکی هێزەکانی لە دەست دا.

پاش ئەو جەنگە لە ماوەی ساڵێکدا توانی ئەو ژمارەیەی کە لە دەستی دابوو کۆ بکاتەوەو دەستی کرد بە چاوشکێن کردنی خەڵکی سنجار، ئەوانەی کە فێر ببوون زۆریان دەکرد لە دانیشتوانی میرنشینەکەدا، شەڕ لەگەڵ سنجاریەکان زیاتر لە چەند سەعاتیچکی نەخایاند و شکان و هەڵاتن، جا هەستیارەکان ئەو سەرکەوتنەیان رازاندەوە بە چەند هۆنراوەیەکی شانازی کردن و سەربڵندیەوە. ئەم سەرکەوتنە کاری خراپی کردە سەر دڵ و دەروونی فەرمانڕەوایانی

(ئەستانە) تووشی کینە هەڵگرتن و حەسوودی کردن ئەمەش یەکێ لە رەوشتەکانی موسڵمانەکانی بنەماڵەی عوسمانی بوو میر خۆی ئامادە کردو هێزی خۆی پێکەوە نا دەستی کرد بە دروست کردنی قەلاو سەنگەرو توندکردنی شوێنی پێویست بۆ بەرپەرچ دانەوەی هێرشی عوسمانیەکان.

لە هەلێك دەگەڕان بۆ لەناو بردنی میرو میرنشینەکەو ماوەش نەدات بە رووسەکان هێرش بهێنە سەر ولاتەکەی ئەمەیان بەهەلێك زانی کە داوای میر بەدرخان بکەن بچێتە لای سوڵتان لە ئەستانەدا ئەم داواکاریەیان لەگەڵ (کەمال بەگ) نارد.

کاتێ میر ئەمەی بەدەست گەیشت خستیە بەردەستی لێپرسراوانی حکومەتەکەی و بیروڕای ئەوانی لەسەر وەرگرت. ئەوان بەم کارە ناڕازی بوون و ئامادەیی خۆیان پیشان دا کە دوا دڵۆپی خوێنی خۆیان بڕێژن لە پێناو میرو نیشتماندا.

بەم بۆنەیەوە گەلێ پەیمان و بەڵگەنامەیان دا لەسەر ئەم هەڵوێستە پاك و خاوێنەدا میر وەلامی نێردراوەکەی دایەوە بە نووسراو کە تێیدا روونی کردبۆوە کە ناتوانی لەم کاتەدا سەر بدات لە مالی بەختەوەری (دار السعادە) بەلام هەر

کاتێ بۆی ڕێکەوت ئەوا مل کەچی فەرمانی میری ئیماندارانەو (امیر المومنین) بە ئەرکێکی ئاینی دەزانێت.

ئەم وەڵام دانەوەیە سوڵتانی تووڕە کرد. جا فەرمانێکی پایەداری دەرکرد بۆ هێرشێکی چاوشکێنانە ناوی نا (هەڵمەتی کوردستان) بە سەرکردایەتی عوسمان پاشا هەروەها فەرمانێکی تریشی دا بۆ کۆکردنەوەی هێزی میللی لە عێراق و وڵاتانی عەرەبی دا کە بچنە پاڵ ئەم هەڵمەتەوە.

لەم کاتەدا چەکی کوردەکان ئەو تفەنگە بوو کە ناسراو بوو بە ناو (شیتبفاتە) هەروەها ئەو ئازایەتیەی کە لە باوك و باپیرانیانەوە بۆیان مابۆوە. وا دەڵێن هەندێ لە کوردەکان ئەم تفەنگەیان بە (٥٠) لیرەی زێر کڕی بوو. ئەو تۆپەی کە عوسمانیەکان هەیان بوو ئەوان لێی بێبەش بوون بەڵکو باوەڕێکی بەهێزیان هەبوو بەم ئایەتە پیرۆزە

(اذا جاء اجلهم لا يستقدمون ساعة ولايستاخرون) صدق اللة العظيم

واتە ئەگەر کاتی مردنیان هات نە ساتێ پێش دەمرێت و نەدوا دەخرێت) ئەوان تۆپەکانی تورکیان وەکو بووکە شووشەی منداڵان دەهاتەبەرچاو کە هی کات بەسەربردنیان (شەمو خەلەف) ناوێك هێرشێکی بردنە سەر سوپای تورکی و توانی دەستبگرێ بەسەر چەند تۆپێك و بیانهێنێتە

ناوەڕاستی مەیدانی جەنگەوەو جەمەدانیەکەی خستە سەر لوولەی یەکێ لە تۆپەکان و بە دەنگێکی بەرز گوتی: (ئەز سەیی بابی تیلی بگیمە) (انا کلب والد تیلی بك) یانی من سەگی باوکی تیلی بەگم مەبەستی میر بەدرخان بوو لە راستیدا کوردەکان وا سەیری ئەم شەڕەیان دەکرد لایان وابوو ئاهەنگێکی بووك گواستنەوەیە. یەکەم ڕووبەڕوبوونیان لە (چەمی زەیتون) بوو.

لە پاش یەك دوو شەڕ کردن تورکەکان زیانێکی زۆریان لێکەوت لە چەك و تەقەمەنی و کوژراودا هێزەکانیان بەرەو شاری موسڵ پاشەکشەیان کردو سەر لەنوێ دەستیان کرد بە خۆ قایم کردنەوە، بەڵام میرو هۆزەکان لە جیاتی ئەوەی ئەم سەرکەوتنە ببێتە هۆی دڵخۆشیان. گەڵێ دڵتەنگ بوون بەم زیانانەی کە لە موسڵمانەکان کەوت لەهەمان کاتدا خۆیان ئامادە دەکرد بۆ شەڕوشۆڕی داهاتوویان جا قەڵا (ئورخ)یان ڕێکوپێك کرد بۆ ئەم مەبەستەیان رژێمی عوسمانیش چەند مەدالیەکی زێڕو زیوی نەخش کراوی دەرکرد کە یادگاریەکی ئەم جەنگە بوو ڕووێکیان بەمە نەخش کرابوو (کردستان محاربەس) واتە جەنگی کوردستان. لە ڕووەکەی تریش وێنەی کێوێ بوو. لەسەر لوتکەکەیدا قەڵای (ئورخ) دیار بوو. هێزەکانی عوسمانی بە

توندی گەمارۆیقەلاکـەیان دەدا. جارجـاریش هێرشـیان دەکردە سەر کوردەکانیش بەردەوام بەرپەرچیان دەدانەوەو بەرگرییان دەکرد.

میر بەدرخان باشی دەزانی کە توانای ئەوەی هەیە بۆ ماوەی چەند ساڵێك رووبەرووی تورکەکان بوەستێ لە کۆتاییشدا سەرکەوتن هەر بۆ ئەوە. بەڵام لەبەر ئەو بیرو رایەی کە دەبێ مل کەچی (میر ئیمانداران) بێت. یان مردن لە پێناو هیواو مەبەستەکەیداو تێك شکاندنی دوژمنانی ئەمە بووە هۆی نیگەرانی و دوودڵی ئەوەو سەرەڕای ئەمەش بیرو رای ئەنجومەنی زانایانی ئاینی کە بەردەوام پێیان دەگوت کە نابێ بەردەوام بێ لەسەر رشتنی خوێنی موسڵمانان و هەروەها ئۆباڵ خستنە ئەستۆی خۆی ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە ئالأی خۆ بەدەستەوەدان بەرزبکاتەو میر یەکسەر گواسترایەوە بۆ بنکەی سەرکردایەتی سوپا پاش چەند رۆژێ خۆی و برا گەورەکەی سالح بەگ و برا بچوکەکەی ئەسعەد بەگو هەموو لێپرسراوانی حکومەتەکەی گواسترانەوە بۆ ئەستەنبۆل..... جێ باوەڕ پێکراوەکەیەکی لە رامیارە تورکەکان باسی ئامادە بوونی میر بەردخان کراوە لە (مالی بەختەوری)دا بێ ئەوەی دەست نیشانی شەڕ لەگەڵ کوردەکاندا بکات لەبەر ئەوەی چونکە سوڵتان خۆی

فەرمانی بەبلاونەکردنەوەی دا لە گۆڤارو رۆژنامەکانداو نە لە ڕێگەکانی تری پروپاگەندەو راگەیاندن.

هەروەها لەم پەڕاوەدا واهاتووە کە بەردخان لە میرە بەناوبانگەکانی کوردانە ویستویەتی هۆزەکانی (طیار)ی ئاسوریەکان سالی ١٢٦٢ بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە ئەم رووداوە لە لایەن قۆمیساری ئینگلیزی (هاری لایارد)ەوە باسی کراوە. رژێمی ئینگلیزی لەم هەلس و کەوتەی رازی نەبوو جا لەگەلْ فەرەنسادا ڕێکەوتن کە داوا لە (باب العالی) بکەن لە کوردستان بیگوازیتەوە جا بە گوێرەی فەرمانی (رشید بەگ صدر الاعظم) سەرۆکی وەزیران قۆمیسارەکە بۆ ئەستانە گوێزرایەوە.

ئەگەر لە پەڕاوی جێباوەڕ پێکراوی ناوبراودا باسی ئەو هێرشە کرابیْ بۆ سەر میر بەدرخان کە بەهۆی دەست تێوەردانی ئینگلتەرەوە رووی دابێ. ئەمەیان هیچی بەراست نازانین. ئەگەر دەست تێوەردانی ئینگلتەرە راست بی ئەوە یارمەتی میری نەدەدا لە دوای سەرکوەتنەکەیدا لە شەڕی (رووباری زەیتون) ئەگەر بە پاسەوانیەتی ئینگلتەرە رازی بووایە ئەوە حکومەتێکی کوردی سەربەخۆ دادەمەرزان. بەلام ئەو دیلیەتی لای عوسمانیەکانی لا باشتر بوو لەو بەختەوەریەی کە چاوەڕوانی لێوە دەکرد لای ئینگلتەرە.

ئەوەی جێی داخە ئەوەیە خۆشی خۆی و بەختەوەری ماڵو منداڵەکانی و رۆڵەکانی گەلەکەی هەمووی لەدەست داو لەناوی بردو جێی هێشت لە ژیانێکی پڕ دەردەسەریو شەرمەزاریدا کاتێ میر ئامادە بوو لای سوڵتان ئەم چوارینەی خەیامی بۆ خوێندەوە کەدەڵێ:

(ناکردە کناە درجها کیست بگو
وان کس کە گنە نکردە چون زیت بگو
من بدکنم وتود مکافات دهی
یست فرق درمیان من توجست بگو

بانان بەیتەکە
خوایە پێم بڵێ کەس هەیە بێ گوناە بێ
ئەوەی گوناهی نەبێ چۆن دەژیت پێم بڵێ
من خراپە بکەم و تۆش سزام بدەی
جیاوازیت چییە لەگەڵ مندا

ناوەرۆکی ئەم چوارینەیە جێی رەزامەندی سوڵتان بوو فەرمانی دا ئەم و ئەوانەی لەگلیایەتی بگوێزرێنەوە بۆ شاری (قندیە) لەد وورگەی (کریت) هەروەها مووچەیەکی مانگانەی بۆ بڕیەوە لە جیاتی ئەو ماڵو سامانەی کەدەستی بەسەر گیراوە کە دەیکردە بیست هەزار قروش ئەو ماڵو سامانەی کە ئەو بەجێی هێشت بەم جۆرە بوو.

شەش (ملاحە) کە ساڵانە شەش ملیۆن قروشی دەدایە دەست هەروەها بیست هەزار سەر رەشەوڵاخی هەبوو.

لە ساڵی (١٢٠٨) میرات گرانی داوای ماڵ و سامانەکەی باوکیان دەکرد لە (ملاحات) و شتی‌تر، ئەنجومەنی شووورای وڵات بڕیاریدا کە بۆیان بگەڕێننەوە. بەڵام ئەنجومەنی وەزیران شتێکی تریان دەویست جا فەرمانگەی کاروباری بڕیارەکەی هەڵوەشاندەوە. پاش ئەوە (بەدرخان) بۆ ماوەی (١٠) ساڵ لە (قندیە) مایەوە سوڵتان مەجید بڕیاری دا بیگەڕێنتەوە بۆ ئەستەنبوڵ. هەوڵی دەدا خۆی لێ نزیک بکاتەوە سەر سوڕمانی خۆی پیشان دەدا دەربارەی بنەماڵەی زۆرەکەی فەرمانی بە رەشید پاشا دا کە کاروباری بۆ ساز بکات بۆ دەرکردنی بڕیاری لێبوردن بۆ ئەم مەبەستە رۆژی سێشەممە لە مانگی رەمەزاندا کۆبوونەوەیەك کرا لەلایەن فەرماندەی گشتی هێزی چەکدارو عومەر پاشا و علی غالب پاشاو راوێژکاری دەوڵەت هی سوپای عەرەبستان (وڵاتانی عەرەب) و وەزیری دارایی. دەربارەی مەسەلەکە دووان و گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە وا باشترە سوڵتانی خاوەن شکۆنامەیەك بۆ میری بنێرێ و دڵنیای بکات. هەروەها بیگەڕێنێتەوە بۆ (کریت) بۆ ئەوەی نزیك بێت لەو ملکانەی کە لەوێ کڕیویەتی و سوود لە قازانجەکەی

وەربگری ئەوە بۆ ئەو باشترو لەبارترە ئەك لە (ئەستانە) بێت یان بینێرتە بەشی ئەوروپای تورکیا. یان ئەنادۆل. پاش ئەوەی گەلێ دیاریان بەسەرا رژاند. هەروەها بەسەر ئەوەکەیدا گەڕایەوە (کریت) و هەشت ساڵی تر لەوێ مایەوە. کاتێ کە ناخۆشی کەوتە نێوان موسڵمان و مەسیحیەکان لە (کریت). هەندێ لە مەسیحیەکان پەنایان بردە ماڵی میر لە (قندیە) ئەویش پارێزگاری لێ کردن.

هەروەها چارەسەری ئەو ناخۆشیەشی کرد کە لەشاری (خانیە)دا رووی دا ناکۆکیەکەی ئەهێشت و هێمنی گەڕایەوە.

پاشان خۆی و خێزانەکەی گەڕانەوە بۆ ئەستەنبۆل حەوت ساڵی تر لەوێ مانەوە. پاشان چووە شاری دیمەشق و دووساڵیش لەوێ مایەوەو پاشان کۆچی دوایی کرد. بیست و یەك کوڕو بیستو یەك کچی لەدوای بەجێما. بەم جۆرە ژمارەی ئەوەکانی بەکوڕو کچەوە گەیشتە (٤٢) کەس ئەوکاتەی کە ئەو لە ژیاندا مابوو بە ئەوەی منداڵەکانیەوە گەیشتبووە (٩٦) منداڵ. تەرمەکەی لە گەڕەکی (صالحیە) لە دیمەشقدا نێژرا ساڵی (١٢٨٥) رەحمەتی فراوانی خوای لێ بێ.

کاتێ نەوەی میر گەیشتبووە (٤٢) کەس لە کوڕو لەکچ و جگە لە حەوت کەسی تریش ئەگەر سوودی میراتەکەو ئەو موچەیە دیاری ئەوە ناکات کە پێی بەڕێوە بچن. سوڵتان فەرمانی دا کە چوار کوڕە گەورەکەی دابمەزرێنێ (نەجیب و مستەفاو بەدریو بەحری) لە قایمقامیەت لە هەندێ قەزاکانی شارەکانی وڵاتدا هەروەها مووچەیەکی گونجاوی مانگانەی دانا بۆ ئەو کەسانەی کە پلەیان لەوانە نزمترە بەگەیشتنی سوڵتان عبدالحمید بە کورسی فەرمانڕەوایی کارەساتی زۆری یەك لەدوای یەکدا رووی دەدا. مەدحەت پاشا لێهاتووی بەناوبانگیان لەناو برد جگە لەگەورە پیاوانی تری وڵات شاری تونسو قارس (ولاشیا) لە ئیمپراتۆریەت جیا بوونەوە خرانە سەر رۆمانیا. هەروەها (یفدان) و دانوب و رۆم ئیلی رۆژهەلاتی چیایی رەش ئەوانیش جیابوونەوە. ئەم کارەساتانە یەك لەدوای یەکدا دەهاتنە پێش وا رێکەوت لەگەڵ سەرەتای شەڕکردن بێ لەگەڵ روسیادا.

یەکێ لە کوڕەکانی بەدرخان داوای هاوبەشی کردنی کرد لەم جەنگەدا. خەڵکی لە دەوری خۆی کۆکردەوەو لێپرسراوانیش داواکاریان بۆ جێبەجێ کردن. بەدری بەگ رووی کردە دیمەشق و حسێن کەنعان بەگ ئەتنەو عەلی بەگ روویان کردە (ئەستانە) بەحری بەگ چوو بۆ کوردستان

خەڵکیان کۆکردەوە. هەمویان ئاڵای جیهانیان بەرز کردبووە. یەکەمیان سێ هەزار کەسی کۆکردەوە. دووەمیان سێ هەزارو هەشت سەد کەسی کۆکردەوە. سێیەمیان سێ هەزار. چوارەمیان ژمارەیەکی گەلێ زۆر. بەلاّم کاتێ کە دەوڵەت یارمەتی ئەوانەی نەدا لە تەقەمەنی و خواردەمەنی ناچار بەدری بەگ ئەوەی هێزەکەی پێویستی پێی بێ گەلی کوردەوەری گرت و خستیە ژێر دەستی یەکێ لە باوەڕپێکراوەکان مستەفا ئاغا ملی لە هێزەکەی حسێن کەنعان بەگدا کەسێ هەزارو هەشت کەس بوون، هەموویان شەهید بوون کە تەنها هەشتا کەسیان لێ گەڕایەوە بەلاّم حسێن بەگ بەفرو قوڕە لیتە گەلێ ماندویان کردبوو کەڕو کوێر بوو. شامل بەگ پاش ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە چەکدارەکانی شەهید کران گەڕایەوە گۆڕەپانی (وغی) کە (٢٥) برینی لە لەشیدا هەبوو. پاش ئەوەی رووسەکان هەردوو شاری (قارس و باتۆم)یان داگیرکرد. دیلەکانیان بەرەڵلاکرد کە زۆربەیان لەبارێکی تەندروستی خراپدا بوون. بریندارو سەقتیان تێدابوو. هەروەها بریندارەکانی علی شامل بەگ لەگەڵ بوون کە رژێمی سوڵتان پلەی (قول ئاغاس)ی پێ بەخشیبوو (سەرۆکی کەتیبەی) ناردبوویە شاری (ئورفا - رها). حسێن بەگ لە دادپەروەری دەوڵەت

بێبەش کراو گەڕایەوە وڵاتەکەی لەسەر سوودی ئەو میراتە دەژیا کە باوکی بۆی بەجێی هێشتبوو.

مانەوەی ئەو لەوێدا لای چەند لێپرسراوی جێی گومان بوو بە سوڵتانیان ڕاگەیاند کە مانەوەی ئەو لەوێدا لەوانەیە ببێتە هۆی ڕوودانی چەند گێروگرفتێك فەرمانی گوێزانەوەی دەرکرا بەڵام ئەو گوێی پێ نەداو دوو ساڵی تریش لەوێ مایەوە.

ڕاوێژکار عزت پاشا فەرمانی دا هێزێك بنێرێت بۆ هێنانی ئەو بۆ پایتەخت. ئەم هێزەش بەسەرپەرشتی براکەی بوو (بەحری بەگ) کاتێ گەیشتە (بۆتان) توانی براکەی وا لێ بکات کە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ئەستەنبۆل لەوێدا کرایە ئەندامی ئەمینداری پایتەخت مانگانەی سی هەزار قروش بوو. گوێزرایەوە بۆ شاری نابلس گەڕانەوەی حسێن بەگ بۆ کوردستان لە پێناوی پاراستنی خۆی و براکانی بوو لەمەترسی سولتان و هاوکارەکانی و نیمچە حکومەتەکەیدا. پاش تێکشکانی هێزەکان بەهۆی هەڵمەتەکانی ڕوسەکانەوە.

ئەگەر بهاتبایە حسێن بەگ نیازی جیابوونەوەی هەبوایە لە ڕژێمی حەمیدیەکان ئەوە دەیتوانی لەدوو تیپی کوردەکانەوە بە ئاسانی یەکێکیان بخشێتە لای (سامسون)ەوە ئەوی تریشیان بەروە کەنداوی

ئەسکەندەرونە. بەلام پەیوەندی ئاینی بەخەلیفەوە ماوەی ئەوەی نەدا ئەم کارە بکات. ئامۆژگارییەکانی (بەحری) برای رێیان لەوە نەدەگرت بۆ گەڕاندنەوەی کورسی میرنشینی بۆتان.

ماوەیەکی زۆری نەبرد لەسەر هاتنەوەی حسێن بەگ بۆ (ئەستانە) فەرمانی دوورخستنەوەی دەرکرا بۆ قودس. هەروەها دوورخستنەوەی براکانی (بینا باش) علی شامل پاشاو مستەفا بەگ خالد بەگ بۆ شام. هەروەها بەحری بەگ بۆ ترابلسی رۆژئاوا ئەمەش سالی (١٣٠٠) بوو.

هەموو هاتنە سەر ئەو بیرورایەی کە هەریەکێکیان ببن بە قایمقامی ئەو شوێنەی کە بۆی نێردراون. رازی بوونیان بەمە هۆیەکەی، خۆژیاندن بوو. هەروەها رزگار بونێك بوو لە شەرمەزاری و بێدەسەلاتیو لەم بارەیەوە ئەم دێرە هۆنراوە عەرەبییە لەسەریاندا دەگونجی کەدەلێ:

اذا يئس الانسان طال لسانه كنسور مغلوب يصول على الكلب

میرەکان دوانیان لەدەریاوە بۆ (تەرابزۆن) دەچوون بەهۆی یەکێ لەو کەشتیانەی کە رووەو دەریای ناوەڕاست دەڕوات.

کاتێ کە گەیشتنە (تەرابزۆن) فەرمانگەی سنی فەرمانی دا کە بیانێرنە ئەستانەوە لەوێدا. دایان بمەزرێنن. هێندەی

پێ نەچوو مستەفا پاشای برا گەورەیان کۆچی دوایی کرد ئەویش پێش مردنی رایسپاردبوو کەهەندێ پارە خەرج بکرێ بۆ دروست کردنی چەند قوتابخانەیەك لە کوردستاندا نیشتمانی باب و باپیران. بۆ جێبەجێ کردنی ئەم راسپاردەیە بڕیاردرا مستەفا ئەفەندی کە کوڕی نیشتمان پەروەری کوردی بەناوبانگ (شەریف)ە دابنرێ بۆ ئەم کارە. ئەویش ئەو کاتە لە ئەستەنبوڵ بوو. پارەکەی وەرگرت و چوو بۆ کوردستان. لەکاتی گەڕانەوەیدا گیراو حکومەت نووسراوی راسپاردەکەی لێ وەرگرت. بەم هۆیەوە کوردەکان لە خوێندن و نووسین بێ بەش کران.

سوڵتان ستەمکار ئەم کارەی لا تاوانێك بوو فەرمانی دا کە نەوەکانی بەدرخان بگیرێت. علی شامل و ئەمین موراد و حەسەن و کامل خرانە بەندیخانەی (تاشی قشلە)وە پەیوەندیان لەگەڵ خەڵك لێ قەدەغە کردن پاشان گوێزرانەوە بۆ بەندیخانەی (باب سنابتە) بۆ ماوەی سێ مانگ لەم بەندیخانەدا مانەوە ئەوەش بە تاوانی ئەوەی کە کاریان کردووە بۆ بڵاوبوونەوەی خوێندەواران لە کوردستاندا. بردیانن بۆ دادگای دەست پێکردن بۆ پرسیارو وەڵام لە رۆژی دادگا کردندا تا شەویشی بەسەر داهات هەر بە چاوەڕوانی مانەوە. لە کاتژمێر یەکی دوای نیوەشەودا یاوەری

سەرەك وەزیران (الصدر الاعظم) هات و ئەوانی برد بۆ دیوانی سەرۆكایەتیو فەرمانی لێ بوردنیان پێ ڕاگەیاندن ئەمەش ساڵی ١٣١٤ بوو.

| ژ | ناوەكان | كوڕ | كچ | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | حامید بەگ | | ١ | كوڕە گەورەیە، كوێرە لە دیمەشق دەست بەسەر, |
| ٢ | بەدری بەگ | | ١ | ئەندامی ئەنجومەنی شورای وڵات، دوورخراوتەوە بۆ برودوس |
| ٣. | عوسمان بەگ | ٦ | ٤ | جەنەراڵە لە سوپا، دوورخراوەتەوە بۆ تەرابلوسی ڕۆژئاوا |
| ٤ | عەلی شامل بەگ | ٢ | ٤ | دوورخراوەتەوە بۆ ترابلوس |
| ٥ | ئەمین بەگ | ٤ | ١ | پشكێنەری داد لە ئەنقەرەو قورتبە، دوور خرایەوە بۆ ئەسپانیە |
| ٦. | حسێن كەنعان بەگ | ٢ | ٣ | پارێزگاری (یوغزاد) گۆڕاوە |
| ٧ | موراد بەگ | ٢ | ١ | بە كەشتی نێردرا بۆ مەككە |
| ٨. | محەمەد عەلی بەگ | | ١ | سەرۆكی جەندرمەی بەیروت (دەست بەسەرە) لە ئەستەنبۆلدا مرد، هەروەها كچەكەشی |
| ٩. | مەدحەت بەگ | ١ | ١ | بە كەشتی نێردرا بۆ مەككە |
| ١٠. | عبدالرحمن بەگ | | ١ | بەكەشتی نێردرا بۆ مەككە |
| ١١ | حەسەن بەگ | ٢ | ١ | بەكەشتی نێردرا بۆ مەككە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٢ | کامل بەگ | ١ | ١ | قایمقامی حەیفا، دوورخراوە بۆ رودس |
| ١٣ | تاهیر بەگ | | ١ | سەرۆکی دادگای دەست پێکردنی حەلەب، شوێنی دیار نییە |
| ١٤ | خەلیل بەگ | ٢ | ١ | بەکەشتی نێردرا بۆ مەککە |
| ١٥ | زوبێر بەگ | | | یارمەتی دەری سەرۆکی شارەوانی دیمەشق (دەست بەسەر) بێ نەوەیە |
| ١٦ | غالب بەگ | | | کوڕی حامید بەگە (دەست بەسەرە لەدیمەشق) |
| ١٧. | عەبدولرەزاق بەگ | ١ | ١ | کوڕی نەجیب بەگە، بەکەشتی نێردرا بۆ مەککە |
| ١٨. | بەدرخان بەگ | | | کوڕی نەجیب بەگە، بەکەشتی نێردرا بۆ مەککە |
| ١٩ | سەعید بەگ | | | کوڕی نەجیب بەگە، بەکەشتی نێردرا بۆ مەککە |
| ٢٠. | ئیبراهیم بەگ | | ١ | کوڕی مستەفایە، دوورخراوە بۆ قەیسەری |
| ٢١. | قەدری بەگ | | | کوڕی شامل بەگە (٢٢) ساڵە گیراوە لەلایەن ئاسایشی گشتی |
| ٢٢. | ثریا بەگ | | | کوڕی ئەمین بەگە لە نووسینگەی سوڵتان بوو، دوورخرایەوە |
| ٢٣ | شەرەف بەگ | | | بەکەشتی نێردرا بۆ مەککە |
| ٢٤. | سەعدی بەگ | | | کوڕی حسێن بەگە تەمەنی (١٢) ساڵە گیراوە لەلایەن ئاسایشی گشتیەوە. |
| ٢٥. | فەرید بەگ | | | کوڕی تاهیر بەگە، بەکەشتی نێردرا |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | بۆ مەککە |
| ٢٦ | فائیز بەگ | | | کوڕی خەلیل بەگە، بەکەشتی نێردرا بۆ مەککە |
| ٢٧ | سلێمان بەگ | | | کوڕی خالید بەگە، بەکەشتی دوورخرایەوە بۆ مەککە |
| ٢٨ | سالح بەگ | | | کوڕی کەریم. بەکەشتی نێردرا بۆ مەککە |
| ٢٩ | فوئاد بەگ | | | کوڕی کەریم، بەکەشتی نێردرا بۆ مەککە |
| ٣٠ | خەلیل بەگ | | | کوڕی کەریم بەگە، بۆ میسر هەڵات |
| ٣١ | خالید بەگ | | | کوڕی کەریم بەگە، یوزباشی دکتۆر هێندەی نەمابوو دوور بخرێتەوە بۆ یەمەن، ئێستا لە بەیروت گیراوە |
| ٣٢ | غالب پاشا | | ٢ | زاوای سوڵتانە، پارێزگاری (مدللی)یە، دوورخرایەوە بۆ ئەزمیر |
| ٣٣ | ئیسماعیل بەگ | ١ | | زاوای سوڵتانە، پشکێنەری داد بوو لە حەلەب و ئەزنەنە، شوێنی دیار نییە. |
| ٣٤ | مەحمود بەگ | ١ | | کوڕی برای میر بەدرخانە، لە دیمەشق گیراوە. |
| ٣٥ | عومەر بەگ | | ١ | زاوای سوڵتانە، لە دیمەشق گیراوە |
| ٣٦ | حسێن بەگ | | | یوزباشی (کوڕە مام) بۆ یەمەن دوور خرایەوە |
| ٣٧ | حەمەد بەگ | | | ئەفسەرە (کوڕە مام) بۆ یەمەن دوورخرایەوە |
| ٣٨ | جەمیل بەگ | ٢ | | قایمقامی سەربازی زاوای نەجیب |

| | | |
|---|---|---|
| | | بەگە. بەکەشتی دوورخرایەوە بۆ تەرابلوسی رۆژئاوا |
| ٣٩. بەکر بەگ | ١ | سەرۆکی پشکێنەرانی دارستانان، زاوای حسێن بەگە، بۆ میسر هەڵاتووە |
| ٤٠. سەعید بەگ | | کوڕی حافیز پاشایە زاوای موراد بەگە بۆ ئاتنە دوور خرایەوە |

تێبینی: کۆی هەمووی دەکاتە ١٠٧ کوڕو کچ

ناوی ئەو کەسانەی کە گومانیان لێ کراوەو دوورخراونەتەوە لیون بەگ. دوورخراوەتەوە چونکە دراوسێی عبدالرزاق بەگ بوو. حسن فوئاد پاشا چاودێری قوتابخانە بوو بە پلەی (لیوا) بۆ رودۆس دوورخرایەوە، چونکە لە ماڵی عبدالرزاق بەگ وێنەیەکی هەبوو. زۆر کەسی تریش هەبوون لە خاوەن پیشەکان. وەکو چایچی و ئوتێل و بەرگدروو و هیتریش.

## چەند تێبینیەك دەربارەی بنەماڵەی میر بەدرخان

ئێمە دەمانتوانی هەر لەیەکەم رۆژی کە عبدالحمیدی دووەم بوو بە سوڵتان دەنگمان بەرز بکەینەوەو جی پێویست بوایە بمانکردبایە. دەربارەی ئەو زوڵم و ستەمەی کە دەیکرد. بەلأم هەندێ تێبینی تایبەتی و گشتی وای لێ دەکردین کە لەسەرەخۆو هێمن بین، چونکە عبدالحمید هێندەی نەمابوو بروخێت. پێویستە ناکات ئێمە وا لێك بدەینەوە وەکو ئەم جۆرە خێزانانەین کە چاوەڕوانی عیزرائیل دەکەین بۆ رزگار کردنی ستەم لێکراوان و ژێردەستان. با ئەوە روون و ئاشکرا بێ ئەو گەلەی کە چاك و خراپیان لێ نەپاراستوون و نزیکەی (٣٠٠) ساڵە بێ بەشە لە ماف نەتەوایەتی خۆی، هیچ کاتێك پشتی ناداتە بەرداری زوڵم و ستەمکاری. ئێمە سوپاسی عبدالحمید ستەمکار دەکەین کە چاوی ئێمەی کردەوە دەربارەی ئەم ستەمە. ئەم سوڵتانەش هەر دەگاتە چارەنووسی رەشی خۆی.

## هەندێ لە نەوەی نەوەکانی میر بەدرخان

- ئەمین بەگ پشکێنەری داد لە ئەنقەرەو قورتبەدا.

- ثریا، لە پاریسدا کۆچی دوایی کرد، کچێکی هەبوو بەناوی (قدرت) هەروەها کوڕێکیشی بەناوی (حقی) لە قاهیرەدا مردن (قدرت)کەمرد چوار کچ و دوو کوڕی هەبوو، بەلاّم (حقی) ژنی نەهێنابوو.

- جەلادەت سالّی ١٩٥١ لەدیمەشق کۆچی دوایی کرد. پارێزەر بوو، خزمێکی خۆی هێنا کە ناوی (رۆشن) بوو، کچ و کوڕێکیان بوو.

- کامەران، لە پاریس کۆچی دوایی کرد. لەوێ ژنی هێنا، وچاغ کۆر بوو.

- مقدر، لە ئەلّمانیا دەیخوێندو لەوێش کۆچی دوایی کرد، ژنی نەهێنا.

- حامید بەگ کوڕە گەورەیە لەدیمەشق بەندکرا، پاشان بووە خاوەن دووکوڕو یەکەمیان (غالب بەگ ) بوو کە دەبێتە خاوەنی زۆر کوڕان. وەکو باوکی لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد. کوڕی دووەم (عابدین) کچی مامی خۆی هێنا کە کچی میر سالح ، ناوی لەیلا بوو، بەلاّم مندالّی نەبوو. ژنێکی تری

هێنا یەك کوڕی لە ئەو بوو کە ناوی (فائیز) بوو ئەویش لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد. (فائیز) دوو کوڕی هەبوو بەناوی (عابدین، عەمار)کچێکیش بەناوی (نەرمین). لەدیمەشق دەژین. فائیزیش هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد.

- بەدری بەگ، ئەندامی ئەنجومەنی راوێژکاری دەوڵەت، دوور خراوە بۆ (رۆدۆس) تەنها کچێکی لە پاش بەجێما کە ناوی (سامیە)بوو کە دابوویە نەوەیەکی مامی میر سالح ئەویش کچێکی لێ بوو بەناوی (رۆشن) ئەویش شووی کرد بەیەکێ لە نەوەکانی میر بەدرخان. کچێکی بوو بەناوی (سینەم خان) و کوڕێکیش بەناوی (جەمشید).

- عوسمان بەگ، بەپلەی جەنەڕاڵ لە سوپا دامەرزابوو، دوورخرایەوە بۆ (تەرابلوسی رۆژئاوا) نەوەیەکی زۆری هەیە. ئەوەی من بزانم کچەکەیەتی (زەینەب خانم) کە خاوەنی کچێك بوو ، کچێکی تریش بەناوی (زەهرا) کە شووی بەیەکێ لەخەڵکی (قودس کردو سێ کوڕو دوو کچی بوو) لە (عەمان) کۆچی دوایی کرد کوڕەکانی زۆر نەوەیان لە پاش بەجێما. ژن و پیاوێك لە نەوەکانی عوسمان بەگ دەناسم کە لە ئەستەنبول دەژین.

- علی شامل بەگ، دوور خرایەوە بۆ تەرابلوسی رۆژئاوا بەکەشتیەك بۆ مەککە دەڕۆیشت نەوەکانی لە تورکیادا دەژین هیچ کەسێکیان لێ ناناسم.

